وتاری بیست و چوار

زنجیره وتاری (شیرک و شیرکی گوێڕایەڵیکردن)

# الشرك وشرك الطاعة

## تەواوکەری؛ ئەندامانی پەرلەمان لە قورئانی پیرۆز

## تكملة؛ أعضـــاء البرلمـــان في القـــرآن الكـريم


شێخی موجاهید

أبو علي الأنباري تقبله الله



وەرگێڕان و ئامادەکردنی

پێگەی ڕاستەڕێ






پێگەی ڕاستەڕێ

بسم الله الرحمن الرحيم

وتاری

شێخ ئەبی عەلی ئەنباری - تقبه الله-

وتاری (بیست و سێ)

بەناونیشانی

تەواوکەری: ئەندامانی پەڕلەمان لە قورئانی پیرۆز

تكملة:حكم اعضاء البرلمان في كتاب الله تعالى

وەرگێڕانی

پێگەی ڕاستەڕێ



الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

خوایە حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنکەوتنی، وە باتڵیشمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بکە کە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودمەندمان بکە بەوەی فێرمان دەکەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بکەیت کە کار بە زانستەکەیان دەکەن، خوایە زانستەکەمان بکە بە بەڵگە و حوججە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیکەیتە بەڵگە بەسەرمانەوە ئەی چاکترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بکە و کاروبار و هەوڵ وکۆششم بۆ ئاسان بکە و گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم پاراو بکە تا لە گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا کردەوەکانم چاك بکە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێکی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوانت، لە پاشاندا:

ئەو ئایەتە پیرۆزەی لە لای وەستاین ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَى ٱلشَّيۡطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمۡ وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُواْ لِلَّذِينَ كَرِهُواْ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ سَنُطِيعُكُمۡ فِي بَعۡضِ ٱلۡأَمۡرِۖ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِسۡرَارَهُمۡ ﴿٢٦﴾ فَكَيۡفَ إِذَا تَوَفَّتۡهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُواْ مَآ أَسۡخَطَ ٱللَّهَ وَكَرِهُواْ رِضۡوَٰنَهُۥ فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٢٨﴾﴾[1] ، واتە: بەڕاستی ئەوانەی پاشگەز بوونەوە و بەرەودوا گەڕانەوە، دوای ئەوەی ڕێگەی هیدایەت و ئیمانیان بۆ دەرکەوتبوو، ئەوانە شەیتان بە فێڵ و تەڵەکە تەماداری کردبوون، بەهیوای تەمەن درێژی و خۆشگوزەرانیش فریوی دابوون * ئەو زاڵ بوونی شەیتانە بەهۆی ئەوەوە بوو کە دەیانوت بەوانەی کە داخ لەدڵ بوون بەرامبەر ئەوەی الله دایبەزاندووە کە قورئانە: ئێمە لەمەودوا لە هەندێك هەڵوێستدا بە قسەتان دەکەین، خوایش خۆی چاك ئاگادارە لەو نهێنی و پیلانانەی کە دەیشارنەوە * ئاخۆ حاڵیان چۆن بێت کە فریشتەکان لە کاتی گیان کێشانیاندا بەدەم و چاو و بەرەو پشتیاندا دەماڵن * ئەو سوکایەتی سەرەمەرگە بۆیە بەسەریاندا دێت، چونکە ئەوانە شوێنی ئەو شتانە کەوتبوون کە قین و خەشمی الله دەبزوێنێت، وە لەوەش کە بێزار بوون لە ڕەزامەندی الله و ڕقیان دەبووەوە لەو شتانەی دەبوویە هۆی ڕەزامەندی الله، ئینجا الله ـیش کارو کردەوەیانی پووچ و بێ ئاکام کرد.

گرنگە لەبارەی ئەم ئایەتەوە وتەیەکی ئیمامی (الشنقيطي -رحمه الله-) باس بکەین کە لە کۆتایی وتارەکە دەیخوێنمەوە، جا بەشی یەکەم لە ئایەتەکە (إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَى)، مانای (ٱرۡتَدُّواْ) بە واتای گەڕانەوە دواوەیە، ئەگەر ئینسان بگەڕێتەوە دواوە پێی دەوترێت (القهقري)

(١) محمد: ٢٥ - ٢٨.

واتە بەوەی بگەڕێیتەوە بۆ دواوە بەبێ ئەوەی ڕووت وەرگێڕی، ئەمە مانای -ارتداد- (إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِم )، (ٱلۡهُدَى)، مەبەست لە (ٱلۡهُدَى) لێرەدا بریتییە لە هیدایەت و ڕێنموویی الله تعالی لەبەر فەرموودەکەی -تبارك وتعالی- ﴿قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰۗ﴾[1] ، وە مەبەستیش لە هیدایەتی الله تعالی؛ پەڕتوکی الله تعالی -قورئان- و هەروەها ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ)هێناویەتی لە لایەن پەروەردگاریەوە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی مەبەست لە هیدایەتی الله عز وجل قورئانە ئەوا ئەم فەرموودەیەیەتی ﴿وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ﴾[2] ، جا ناوی نا پەڕتوکی هیدایەت، هەروەها ئەم فەرموددەیەی الله تعالی﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَهۡدِي لِلَّتِي هِيَ أَقۡوَمُ﴾[3]، وە دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێت ﴿وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾[4] ، وە قورئان و سوننەت کۆبوونەتەوە لە فەرموودەی الله تعالی ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ﴾[5] ، جا زانایان -رحمهم الله- لە مانای (الهدی ودین الحق) وتویانە: الفرقان ، وەك ئیمامی قوڕتوبی -رحمه الله- دەڵێت: الهدى = الفرقان، ودين الحق = الحجة البالغة، (ابن كثير -رحمه الله-) دەڵێت: الهدى ودين الحق دەڵێت "العلم النافع والعمل الصالح"، وە ئیمامی شەوکانی -رحمه الله- دەڵێت: بالهدى ودين الحق = الإسلام

وە هەر لە چوارچێوەی ئەوەی وتمان لە وانەی پێشوو کە هەر کەسێك دەستبگرێت بە قورئان و سوننەت ئەوا گومڕا نابێت بە ئیزنی الله تعالی، هاوکات دەست پێوەگرتنەکەش لەسەر تێگەیشتنی زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە بێت نەك سەردەمییەکان لە زانایانی کەناڵەکان کە چەندین مەزهەب و ئارەزووی جیاوازیان هەیە، جا کاتێك دەڵێین بەگوێرەی تێگەیشتنی ئەهلی سوننە و جەماعە مەبەستمان لە زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەیە، سەبارەت بەو کەسەی واز لە هیدایەت دێنێت دوای ئەوەی بۆی ڕوون بووەوە ئەوا بەدڵنیاییەوە جیابۆتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ)و شوێنی ڕێگایەکی جیا لە ڕێگای ئیمانداران کەوتووە ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ١١٥﴾[6] ، واتە: ئەوەش دوژمنایەتی پێغەمبەر (ﷺ)بکات و لێی جیابێتەوە لە

(١) البقرة: ١٢٠.
(٢) النحل: ٨٩.
(٣) الإسراء: ٩ .
(٤) الشورى: ٥٢.
(٥) الصف: ٩.
(٦) النساء: ١١٥.

دوای ئەوەی ڕێگەی ڕاست و دروستی بۆ ڕوون بۆتەوە و ڕێبازێك بگرێتە بەر کە جیا بێت لە ڕێگا و ڕێبازی ئیماندارا‌ن، ئەوە ڕووی وەردەچەرخێنین بۆ ئەو ڕووگە و بەرنامەیەی هەڵیــبژاردووە و ڕووی تێکردووە، (لە ڕۆژی دواییشدا) دەیخەینە ناو دۆزەخەوە و دەیسوتێنین کە ئەویش سەرئەنجامێکی زۆر ناخۆش و سامناکە. کەوایە دوای ڕوونبوونەوەی هیدایەت بۆ هەر کەسێك، ئەگەر واز لە شوێنکەوتنی هیدایەت بهێنێت ئەوە بێگومان جیابۆتەوە لە رسول الله ﷺ، وە لەوەی باسمان کرد کە هۆکارەکە بە گشتی لەوەی بۆچی زۆربەی خەڵك ئەگەر هیدایەتیان بۆ ڕوون بێتەوە ئایا بۆچی شوێنی هیدایەت ناکەون؟ هۆکاری ئەمە چییە؟ وتمان ترسان لە لێپرسراوی و سەختییەکانی ڕێگا﴿وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآۚ﴾(١) ، واتە: دەیانوت: ئەگەر ئێمە شوێنی هیدایەت بکەوین لەگەڵ تۆدا لە خاکی خۆماندا دەڕفێنرێین و تووشی نەهامەتی دەبین. وتمان ئەم شتەش هاتوەتە دی هەروەك لە فەرموودەی الله تعالى هاتووە ﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمۡ وَأَيَّدَكُم بِنَصۡرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٢٦﴾(٢) ، واتە: یادی ئەوکاتە بکەنەوە کە ئێوە زۆر کەم و لاوازکراو و بێ هێزبوون لە زەویدا، دەترسان کە خەڵکی بتانڕفێنن جا خوای باڵادەست جێ وڕێی بۆ سازکردن و بەهێزی کردن بە سەرکەوتن و یارمەتی خۆی و لە ڕزق و ڕۆزیی و ناز و نیعمەتە پاکەکان بەهرەوەری کردن بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن. بۆیە ئەوەی کە بووە هۆی ڕێگری بۆ موشریکەکانی مەککە لە شوێنکەوتنی رسول الله ﷺلەسەر هیدایەت کە بۆیان دەرکەوت و ڕوونبووەوە، ئەوان دانیان نا کە ئەمە هیدایەتە و ئەوەی تۆ هێناوتە هیدایەتە، بەڵام ترسان لە ڕفاندن و لە کوشتن بووە ڕێگری بۆیان لە شوێنکەوتنی ئەو هیدایەتەی پێغەمبەر ﷺهێناویەتی ﴿وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآۚ﴾ وە الله تعالى چەسپاندویەتی کە ئەو کەسەی بەم ڕێگایەدا بڕوات ئەوا ئەوەی تووش دێت کە تووشی دێت کە ئەوانیش سێ پێشەکییەکە بوون هەروەك باسکراوە لە ئایەتە پیرۆزەکە (وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ) بۆیە هەمیشە دەیانبینی ژمارەیان کەمە و چەوساوەن و هەروەها دەڕفێنرێن لە لایەن ئەوانی ترەوە، بەڵام کۆتایی ئەم کاروانە لە ئایەتە پیرۆزەکە (فَـَٔاوَىٰكُمۡ وَأَيَّدَكُم بِنَصۡرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ) جا ئەوەی بەم سێ جێگەیەدا تێپەڕ نەبێت، ناکرێت بگاتە ئەم سەرئەنجامانەی الله عز وجل باسی کردووە، بۆیە هەر کەسێك بیەوێت الله عز وجل شوێنی مانەوە و حەسانەوە و ڕزقێکی پاك و شوێنی نیشتەجێبوون و هاوشێوەی ئەمانەی بۆ

(١) القصص: ٥٧.

(٢) الأنفال: ٢٦.

بڕەخسێنێت ئەوا پێویستە لە ڕێبوارانی ئەم ڕێگایە بێت کە کەمینەن و چەوساوەن لە زەویدا و دەترسن لەوەی خەڵك بیانڕفێنن، هەر کەسێك لەوانە نەبێت ناگات بەم ئەنجامە، هەر بۆیەش دەبینی حیزبە بەناو ئیسلامییەکان بە ملیۆنانن و لە هیچ شتێك ناترسن، بەڵام ناکرێت ڕۆژێك لە ڕۆژان الله عز وجل شوێنی مانەوەیان بۆ بڕەخسێنێت یان ڕزقیان بدات لە پاکەکان بەڵکو حاڵیان هەروەك حاڵی موڕتەدان و کافران و ئێزیدییە، هەمیشە بەم شێوەیە دەژین، ئەمە هۆکاری یەکەم بوو، هۆکاری دووەم وتمان دوای ڕوونبوونەوەی حەق؛ بۆچی هەندێك لە خەڵك شوێنی ناکەون؟ ئەمە دەچێتە نێو شوێنکەوتنی هەوەس و ئارەزوو ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ﴾[1] ، واتە: کێ هەیە لەوە گومڕاتر کە شوێن ئارەزووەکانی خۆی کەوتبێت، دوور لە هیدایەت و ڕێنمونی الله. کەوایە هیدایەت لە الله ـوە ڕێك ناکەوێت لەگەڵ هەوەس و ئارەزوو چونکە ئارەزوو بریتییە لەوەی نەفس مەیلی بۆ دەچێت لە سەرپێچیکردنەکانی شەرع، جا کاتێك هیدایەتی الله بۆ ئینسان ڕوونبووەوە دوای ئەمە ناکرێت پێچەوانە و سەرپێچی ئەو هیدایەتە بکات کە بۆی دەرکەوتووە مەگەر شوێنی هەوەس و ئارەزوو بکەوێت، جا لەبەر ئەم دوو هۆکارە وا دەکات لە هەندێك خەڵك شوێنی هیدایەت نەکەون دوای ئەوەی بۆیان دەردەکەوێت و ڕوون دەبێتەوە؛ ئەمە بەشێوەیەکی گشتی، بەڵام لە تایبەتمەندییتی ئەم ئایەتە (إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَىٰ أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى) ئەوانە چینێکی تایبەتن لە خەڵك چونکە هەندێك هۆکاری تایبەتییان هەیە لە هەڵگەڕانەوە لە دینی الله تعالى، بەڵام بەر لە چوونە نێو ئەم وردەکارییە پێویستە ئاماژە بکرێت بەوەی کە ئەم ئایەتە کێ دەگرێتەوە؟ (إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَىٰ أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى) کێ دەگرێتەوە ومەبەست کێیە لەم ئایەتە پیرۆزەدا، زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە -رحمهم الله- سێ بۆچوونیان هەیە؛ بۆچوونی یەکەم: دەڵێن مەبەست لەوانەی باسکراون لەم ئایەتە بریتیین لە جولەکە، وە بەڵگەیان هێناوەتەوە بە فەرموودەی الله تعالى ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾﴾[2] ، واتە: ئەوانە کتێبمان پێ بەخشیوون پێغەمبەر ﷺ دەناسن هەروەك چۆن نەوەکانی خۆیان دەناسن، بێگومان دەستەیەك لەوان ئەو ڕاستییە دەشارنەوە، لە کاتێکدا دەشزانن محمد ﷺ فرستادەی الله ـیە. جا جوولەکە هیدایەتیان بۆ ڕوونبووەوە بەڵام دوای ڕوونبوونەوەکە شوێنی ئەو هیدایەتە نەکەوتن کە بۆیان ڕوونبووەوە و دەرکەوت بە بەڵگەی فەرموودەی الله تعالى (وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ) جا دەیناسن ﷺ هەروەك

(١) القصص: ٥٠.

(٢) البقرة: ١٤٦ .

چۆن منداڵەکانی خۆیان دەناسن، وە حەقیش دەناسن بەڵام شاردیانەوە بۆیە [زانایان] وتیان مەبەست لەو ئایەتە جوولەکەکانن، وتەیەکی تر کە ئەویش وتەی ئیمامی تەبەڕی ـیە -رحمه الله- لەوەی دەیگوازێتەوە لە ئیبن عەباس -ڕەزای الله تعالى لە خۆی و باوکی بێت- دەڵێت: مەبەست لەوانەی لەم ئایەتەدا باسکراون بریتیین لە مونافیقەکان، بەڵام دوای سەرنجدان و وردبوونەوە لە ئایەتەکە دەبینی کە ئەو جۆرە کەسانە چینێکی ترن، مونافیقەکان نین بەڵکو ئەوان چینێکی تایبەتن لە خەڵکی، چونکە هەندێك جیاوازی هەیە لە نێوان ئەوان و مونافیقەکان، جیاوازی یەکەم لە نێوان ئەم دەستەیە و مونافیقەکان ئەوەیە کە مونافیقەکان کاتێك دەگەنەوە بە هاودینەکانیان پێیان ناڵێن: " **سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ** " ئەم فەرموودەیەی الله تعالى ﴿وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَىٰ شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ ﴿١٤﴾ اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾﴾[(١)] ، واتە: کاتێکیش (دووڕووەکان) دەگەن بەوانەی باوەڕیان هێناوە دەڵێن: ئێمە ئیماندارین و باوەڕمان هێناوە! ، کەچی کاتێك بە تەنها دەمێننەوە لە لای شەیتانە گەورە و فێڵبازەکانیان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە لەگەڵ ئێوەین، بێگومان ئێمە تەنها گاڵتەیان پێدەکەین و پێیان ڕادەبوێرین * الله سزای گاڵتەجارییەکەیان لێدەسێنێت و (دەیانکاتە پەند و گاڵتەجاڕ)، ئەوە جارێ بەرەڵای کردوون تا کوێرانە مل بنێنن و لە سەرکێشی و لاڕێیی خۆیاندا سەرگەردان بن. کەوایە مونافیق کاتێك دەگات بە هاودینەکەی یاخود بەوەی لە خۆیانە، بەو کەسانە ناڵێت: گوێڕایەڵیتان دەکەین لە هەندێك هەڵوێست و فەرماندا، بەڵکو ئەو لەگەڵیانە بە گشتی و بەوردی، بەڵام ئەم چینەی باسکراوە لەم ئایەتە؛ نەخێر ئەوانە کاتێك هاتن بۆ لای کەسانێك کە ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە، پێیان وتن (**سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ**) کەوایە ئەوان لەوەی دەیڵێن لەگەڵ ئەوانی تر نین بە گشتی و بەوردییش بەڵکو شوێنیان دەکەون لە هەندێك فەرمان و بابەتی ئەوان بە باشی دەزانن، ئەمەش جیاکەرەوەیەکە لە نێوان مونافیق و ئەم چینە لە خەڵك، جیاوازییێکی تر ئەوەیە مونافیق کاتێك بە هاوەڵەکانی یاخود بە هاودینەکانی دەڵێت لەگەڵتانین، ئەمە دەڵێت لە پەنهانی و شاراوەدا (**وَإِذَا خَلَوْا إِلَىٰ شَيَاطِينِهِمْ**) واتە کاتێك تێکەڵاو دەبێت لەگەڵ هاودینەکانیان و هاوڕێگاکانیان دەڵێن (**إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ** ) بەڵام ئەم چینە باسکراوە لە ئایەتەکەدا ئەوە ئەوانە بە ئاشکرا بەوانەی ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله دایبەزاندووە دەڵێن (**سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ**) هەروەك لێدوانەکانیان دەبیستیت لە کەناڵەکان، وە مونافیق هاوشێوەی ئەم وتەیە ناڵێت چونکە مونافیق هەمیشە ئەم قسەیە لە لای هاوەڵەکانی دەکات، جیاوازی سێیەم لە نێوان مونافیقان و ئەوانەدا ئەوەیە کە ئەوانە

(١) البقرة: ١٤ – ١٥.

حەقیان بۆ ڕوون بۆتەوە؛ واتە حەقیان بۆ دەرکەوتووە و لەگەڵ ئەمەشدا بەرەودوا گەڕانەوە و چوونە پاڵ ئەوانە [ئەوانەی ڕقیان لەوەیە کە الله دایبەزاندووە]، بەڵام مونافیق ئەمە کوفر دەشارێتەوە و مسوڵمانبوون پیشان دەدات؛ واتە لەناوەوەیدا هیچ پابەندبوونێك بە حەق نیە، ئەگینا ئەگەر پابەند بێت بە حەق لەناوەوەیدا ئەوا شوێنی حەق دەکەوت، بۆیە مونافیق ئەوەیە کوفر دەشارێتەوە و مسوڵمانبوون دەردەخات، بەڵام ئەوانە حەقیان بۆ ڕوون بۆتەوە و حەقیان بۆ بەدەرکەوتووە و زانیویانە ئەمە حەقە کەچی لەگەڵ ئەمەشدا بەم دەستەیەی کە ڕقی دەبێتەوە لەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە، وتویانە (سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ) بۆیە دەڵێم و داواکاریشم لە الله تعالی پێکابێتم لەوەی بۆی چوومە کە ئەم چینە پەیوەندییان نیە بە مونافیقەکان بەڵکو چینێکی تایبەتن و دێینە سەر درێژەی باسەکەیان بە ئیزنی الله تعالی

وتەی سێیەم لە وتەکانی زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە کە وتەی ئیمامی (الشنقیطي ـیە -رحمه الله-) دەڵێت: ئایەتەکە گشتییە؛ واتە جوولەکە دەگرێتەوە و مونافیقەکان دەگرێتەوە، وە ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە الله عز وجل باسی کردوون لەم ئایەتەدا، ئەگەر ئەمەت زانی، جا ئایا چیرۆکی ئەو جۆرە کەسانە چییە و کێشەکانیان لە چیدایە؟

پرسی یەکەم: ئەوەیە ئەوان کەسانێکن وەستاون لەسەر سەرچاوەکانی تەشریع، وە وتمان لە دیداری ڕابردوو کە خودی هیدایەت دەرناکەوێت (إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَىٰ أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى) واتە دوای ئەوەی ڕوون و ئاشکرابوو، هیدایەت خودی خۆی ڕوون نابێتەوە و ئاشکرا نابێت بەڵکو چۆن هیدایەت ئاشکرا و دیار دەبێت؟ بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانی هیدایەت، جا ئەگەر گەڕایتەوە بۆ قورئان و گەڕایتەوە بۆ سوننە و زانست و زانیارییت بەدەستهێنا بە بەڵگە و بەوەی زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە وتویانە ئەو کاتە لەم سەرچاوانەوە هیدایەتت بۆ ئاشکرا و دیار دەبێت، بۆیە ئەوانە چینێکن هەڵسوکەوتیان کردووە لەگەڵ سەرچاوەکانی تەشریع و لە ڕێگەی سەرچاوەکانیش بۆیان ڕوون بووەتەوە کە هیدایەت لە کوێیە، ئەم چینە بەم شێوەیە الله عز وجل وەسفی کردوون، دوای ئەوەی ئەم هیدایەتەیان بۆ ڕوون بووەتەوە، بەرەودوا گەڕاونەتەوە و پاشگەزبوونەتەوە و خۆیان داوەتە پاڵ دەستەیەکی تر، ئەو دەستەیەش کە خۆیان داوەتە پاڵی، الله عز وجل وەسفی کردوون بەوەی ئەوان ڕقیان لەوە دەبێتەوە کە الله عز وجل دایبەزاندووە، کەوایە ئێستا وێنەکە بەم شێوەیەیە لە لام؛ من هۆکاری جەخت کردنەوەم لەسەر ئەم پرسە چونکە ئەم ئایەتە ئایەتێکی سەرسوڕهێنەرە پەیوەندی هەیە بە واقیعی ئێمە، کەسانێك حەقیان بۆ ڕوون بووەتەوە، جا دەستەیەکی تریش هەن ڕقیان لەوە دەبێتەوە کە الله عز وجل دایبەزاندووە، بەگوێرەی ئەمەش تێدەگەم کە ئەم دەستەیە ئەوانەی ڕقیان لەوە دەبێتەوە الله

عز وجل دایبەزاندووە؛ هەندێك تاك و کەس نین واتە فڵانی کوڕی فڵان لە فڵانە دەوڵەت یان لە فڵانە شار یان لە فڵانە گوند، بەڵکو ئەوانە کەسانێکن ڕێککەوتوون لەسەر ئەوەی ڕقیان ببێتەوە لەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە بۆیە ئەوان دەستە و کۆمەڵێکن، چونکە ئەوەی حەقی بۆ ڕوون بۆتەوە ئەگەر خۆی بداتە پاڵ یەك کەس ئەمە شایانی باسکردن نیە و باس ناکرێت، بەڵکو ئەوەی باس دەکرێت ئەوەیە کە کۆمەڵەی دووەم هەبن و ڕقیان لەوە دەبێتەوە الله عز وجل دایبەزاندووە، وە ئەوانەش وتیان بەوانەی ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە: (سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ) ئەمە بەڵگەی یەکەم لەسەر ئەوەی ئەوانە کۆمەڵێکن

بەڵگەی دووەم لەسەر ئەوەی ئەم دەستەیەی ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله دایبەزاندووە کۆمەڵن: ئەوەیە کە ئەوان کەسانێکن فەرمان و قەدەغەکردنیان هەیە بە بەڵگەی ئەوەی ئەم دەستەیەی یەکەم بەوانەیان وت: گوێڕایەڵیتان دەکەین، بۆیە ئەوانە فەرمانیان هەیە و ڕێگری و قەدەغەکردنیان هەیە، وە هەندێك لە فەرمانەکانیان دەشێت هاوڕێك بێت لەگەڵ شەرع و هەندێکیشیان بەدڵنیاییەوە پێچەوانەیە ئەمەش ڕوونادات تەنها لە کۆمەڵێك نەبێت، جا ئەم کۆمەڵەیە بە ئەندامەکانیەوە ڕقیان لەوە دەبێتەوە کە الله عز وجل دایبەزاندووە، ئەم کۆمەڵەیە سیفەتی دووەمیان هەیە (فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ) بۆیە ئەم کۆمەڵەیە رقیان دەبێتەوە لەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە بەڵام شتێکیان هەیە کە شوێنی دەکەون جا ئەمەی شوێنی دەکەون الله عز وجل توڕە دەکات (اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ) کەوایە کۆمەڵێکن ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله دایبەزاندووە و شتێکیشیان هەیە کە الله تعالی توڕە دەکات، وە ئەوەی الله تعالی توڕە دەکات بەدڵنیاییەوە شەرعی الله عز وجل نیە بەڵکو شەرعێکی ترە، چونکە ئەگەر شەرعی الله تعالی بوایە ئەوا ئەوی توڕە نەدەکرد، کەوایە کەسانێکن ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله دایبەزاندووە و شتێکیشیان هەیە کە الله تعالی توڕە دەکات، جا چۆن دەیسەلمێنیت کە شتێکیان هەیە الله تعالی توڕە دەکات؟ بەهۆی بەکارهێنانی ئامرازی (ما) چونکە ئامرازی (ما) هەمیشە بەکاردەهێنرێت بۆ ناعاقڵ (اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ ) واتە شتێکیان هەیە کە عاقڵ نیە و ئەو کەسانەش شوێنی ئەم شتە کەوتوون کە الله تعالی توڕە دەکات، وە بەدڵنیاییەوە لەم کۆمەڵکارییەش هیچ شتێکیان نیە جگە لە دەستور و قانون و هەروەها ئەو دینەش کە الله تعالی پێی ڕازی نیە، وێنەکە ڕوونە ان شاء الله؟ (ان شاء الله) ، باشە، کەوابوو هیدایەتیان بۆ ڕوون بۆتەوە و کەچی لەگەڵ کەسانێکن ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله دایبەزاندووە لە کاتێکدا لەسەر شتێکن کە الله عز وجل توڕە دەکات، سەبارەت بەوەی ئەو شتانەیان چییە کە الله توڕە دەکات ئەوا باسی هەندێك وردەکارییت بۆ دەکەم بۆ ئەوەی بۆت بچەسپێت کە ئەوانە لەسەر شتێکن

الله عز وجل تورە دەکات، الله تعالی حەڵاڵ و حەرامی هەیە، ئەوانە پابەند نەبوونە پێیانەوە، ئەوانەی ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله دایبەزاندووە ئەوەی کە لەسەرینە ئایا الله عز وجل ڕازی دەکات یان تورەی دەکات؟ بەدڵنیاییەوە تورەی دەکات، بۆیە هەموو ئەو تەشریعانەی هەیانە الله تعالی تورە دەکات جا یەکسانە یەکبگرێتەوە لەگەڵ شەرع یان یەکنەگرێتەوە لەبەرئەوەی تەنانەت کاتێك کۆك دەبن لەگەڵ شەرع حوکم ناکەن بەناوی الله عز وجل بەڵکو حوکم دەکەن بەناوی گەل، ئەگەر ئەمەت زانی، چی ئەوانەی بانگ کرد ئەو دەستەیەی باسکراوە لەم ئایەتەدا، چی ئەوانەی بانگ کرد و وای لێکردن لەسەر ئەوەی وازبێنن لە هیدایەت دوای ئەوەی بۆیان ڕوونبووەوە پاشانیش لەگەڵ کەسانێك بن کە ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله دایبەزاندووە و هەروەها شتێکیان هەیە الله عز وجل تورە دەکات؟ چی وای لەوانە کرد لەگەڵ ئەوانی تر بن؟ الله تعالی باسی دوو هۆکاری کرد؛ هۆکاری یەکەم فەرمووی (**ٱلشَّيۡطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمۡ**) ئینجا فەرمووی (**وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ** ) کەوایە هۆکاری وازلێهێنانەکەی ئەوانە: جوانکردن و فێڵکردنی شەیتان لێیان و هەروەها ئومێد دانی پێیان بە تەمەن درێژی و خۆشگوزەرانی، دێینە سەر ئەوەی (تسويل) چییە و (إملاء) چییە لێرەدا؟ سەبارەت بە (تسويل الشيطان) : ئیمامی تەبەری و ابن كثير و ئیمامی الشنقيطي -رحمهم الله- ئەوانە تەفسیری (سوّل الشيطان)ـیان کرد بە مانای (زيّن)، ئیمامی تەبەری دەڵێت: واتە شەیتان بۆی جوان کردن ئەم گەڕانەوە دواوە و پاشگەزبوونەوەیان، وە ابن كثير -رحمه الله- دەڵێت: (**سَوَّلَ لَهُمۡ**) واتە ئەمەی بۆ جوان کردن و بە چاکی پیشان دا، بە هەمان شێوە وتەیەکی هاوشێوەی ئەمە هەیە هی ئیمامی (الشنقيطي -رحمه الله-)، کەوایە لێرەدا بابەتێك هەیە هۆکاری وازهێنانیان لە هیدایەت و چوونە پاڵ ئەوانەی ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله دایبەزاندووە ئەوا بەهۆی جوانکردن و ڕازاندنەوەی بووە لە لایەن شەیتانەوە، ئەم کارەش مایەی سەرسوڕمان نیە چونکە یەکێك لە هۆکارەکانی شەیتان بۆ هاندانی نەوەی ئادەم لەسەر سەرپێچکردنی شەرعی الله عز وجل؛ جوانکردن و ڕازاندنەوەیە، بەڵگەش لەسەر ئەمە﴿**قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ٣٩**﴾[١] ، وە لە ئایەتێکی تردا ﴿**فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ**﴾[٢] ، وە لە ئایەتێکی تردا ﴿ **أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنٗاۖ** ﴾[٣] ، کەوایە کارەکە لە بنچینەدا کارێکی ناشرین و خراپە و هاوڕێك نیە لەگەڵ شەرع، بەڵام ئەو کەسانە ئەوانەی وازیان لە هیدایەت هێنا و چوونە پاڵ ئەوانە ئیتر دەستیان کرد بە بەچاك زانینی ئەو بارودۆخەی تیایدا بوون هەرچەندە ئەوان لەگەڵ کەسانێکن ڕقیان

(١) الحجر: ٣٩ .

(٢) النحل: ٦٣.

(٣) فاطر: ٨.

دەبێتەوە لەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە، ئەو ئێزیدییەی لەگەڵیانە؛ رقی لێدەبێتەوە یان حەزی پێدەکات؟ سابیئی و نەسرانی و رافیضی ئەوانە حەزی پێدەکەن یان رقیان لێدەبێتەوە؟ بەدڵنیاییەوە رقیان دەبێتەوە لەوەی الله دایبەزاندووە، جا چۆن ئەو کەسانە وازهێنان لە هیدایەتیان بۆ خۆیان خۆش کرد و هەروەها لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانە بین؟ الله عز وجل باسی هۆکارەکەی کرد و فەرمووی (ٱلشَّيۡطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمۡ) واتە بەوەی وای لێکردن ئەم شتە خراپە بە چاك بزانن لە عەقڵیان و تێروانینیان (ٱلشَّيۡطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمۡ) ئەمە هۆکاری یەکەم بۆ وازهێنان لە هیدایەت و کەوتنە خوارەوەیان بۆ ئەم شوێنە لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە، هۆکاری دووەم فەرمووی (وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ )، ئیمامی تەبەری -رحمه الله- دەڵێت: "مانای (وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ ) الله تەمەن درێژی کردن بە ماوەیەك لە ژیان، وە مانای قسەکە - ٱلشَّيۡطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمۡ وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ -"، سەبارەت بە ئیمامی شەوکانی -رحمه الله- بە شێوازێك وتویەتی کە دەریدەخات پلەی وتەکە لاوازە جا دەڵێت: "وتراوە کە ئەوەی (وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ )ـی بۆیان کردووە بریتییە لە الله عز وجل بەو مانایەی بەزوویی سزای نەداون"، وە ئیمامی (الشنقیطي -رحمه الله-) دەڵێت: مانای (وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ ) واتە مۆڵەت و بواریان دەدات بە بوارێکی پەلکێشکردنیان"، ئەوەی ئەم زانایە بەرێزانەمان بۆی چوونە بەدڵنیاییەوە پێکاویانە لەوەی بۆی چوونە، چونکە لە مانای (وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ ) -أملی الله لە- واتە بواری دا و بۆی دوور ودرێژ کردەوە، ئەمە عەرەب وشەکە بەکاردەهێنن بەم مانایە بەڵام دوێنێ وتمان کە مانایەکی تر هەیە نەمبینیوە لەو تەفسیرانەی خوێندوومەتەوە، لەوانەیە لە هەندێك تەفسیر هەبێت کە من نەمخوێندووەتەوە بەڵام لە سنووری ئەوەی خوێندوومەتەوە بینیومە کە بۆ (وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ ) مانایەکی تر هەیە، ئەو موفەسیرانەی وتەکانیانم خوێندووەتەوە ئاماژەیان بۆ نەکردووە، ئەمەش ناڵێم بۆ پاك راگرتنی خۆم بەڵکو ئەمە زانستە و دەمەوێت لەئەستۆی بگرم چونکە ئەمەی دەیڵێم دەدرێتە پاڵ من، جا ئەگەر پێکابێتم ئەوە لە الله وەیە -عز وجل- ئەگەریش جگە لەمە بێت ئەوە داوای لێخۆشبوون دەکەم لە الله تعالی، بۆ نموونە لە (مختار الصحاح) بینیم کە هەروەك دەزانیت فەرهەنگێکی زمانەوانییە، جا (الرازي) لەم پەرتوکەدا دەڵێت: أملى عليه الكتاب، لە چوارچێوەی مانای (الإملاء) دەڵێت: أملى عليه الكتاب، وە بەڵگەی هێناوەتەوە بە فەرموودەی الله تعالی ﴿فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِۚ﴾[1]،کەوایە مانایەکی تر هەیە بۆ (إملاء) جیا لە بوار پێدان(إمهال)و تەمەن درێژی(طول العمر)،ئەم دووانە مانایەکن؛بەڵگەی(إمهال)بە مانای(طول العمر)ئەم فەرموودەیەی الله ـیە سەبارەت بە پێغەمبەر ئیبراهیم﴿لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ لَأَرۡجُمَنَّكَۖ وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيّٗا﴾[2]

(١) البقرة: ٢٨٢ .
(٢) مريم: ٤٦.

واتە ماوەیەکی درێژ، کەوایە لە واتاکانی (إملاء) : الزمن الطويل والدهر، والتأخير والإمهال، هەروەها لە واتاکانی (إملاء) ئەوەیە کە کەسێك قسەیەك بڵێتەوە و یەکێکی تریش بینوسێتەوە ئەمەش بە هەمان شێوە پێی دەوترێت (إملاء)، ئینجا ئەگەر وتمان (مدّ الله فى أعمارهم) ئەوا دەبێتە ئەوەی (الله عز وجل أملى لهم)، بەڵام ئەگەر بابەتەکەمان چڕ کردەوە لە چوارچێوەی مانای ئایەتەکە ئەو کاتە دەڵێین لێرەدا بە هەمان شێوە (الشيطان زين لهم والشيطان أملى لهم) جا مانای ئایەتەکە چی لێدێت کاتێك دەڵێین (الشيطان أملى لهم) ؟ واتە شەیتان قسەیەکی لە سەریان خوێندووەتەوە ئەوانەش ئەم قسەیەیان وەرگرتووە لە شەیتان و ئینجا دەستیان کردووە بە کارکردن بەم قسەیە بەمەش وازیان لە هیدایەت هێنا و خۆیان دایە پاڵ ئەم دەستەیە، ڕوون و ئاشکرایە إن شاء الله ؟ (إن شاء الله)، باشە، بەڵگە چییە لەسەر ئەوەی (الإملاء) لێرەدا بە مانای قسە دەربڕینێك و نووسینەوەی قسەیە؟ ئایەتی قەرز لە سورەتی (البقرة) الله تعالى دەفەرموێت ﴿فَإِن كَانَ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُۥ بِٱلْعَدْلِ﴾ پیاوێك قەرزی وەرگرتووە بەڵام ئەوەی قەرزی وەرگرتووە ناتوانێت یان بەهۆی کەم عەقڵی و نەزانی -کەموکوڕی و نوقسانی لە عەقڵ- یان تەمەنی بچووکە و لاوازە ناتوانێت وشەکانی گرێبەستەکە دەرببڕێت، جا کێ دەربڕینی وشەکانی گرێبەستەکە لەئەستۆ دەگرێت؟ سەرپەرشتیاری ئەم بچووکە؛ واتە سەرپەرشتیارەکە دێت و دەڵێت من فڵانی کوڕی فڵانم و سەرپەرشتیاری ئەم یەتیمەم یان ئەم لاوازە یان ئەم کەم عەقڵە، ئەم بڕە پارەیەم قەرز کردووە لە فڵانی کوڕی فڵان تا ئەوەندە ماوەیە و بە شایەدی فڵانە کەس، کێ قسەکان دەڵێتەوە و دەردەبڕێت؟ سەرپەرشتیاری ئەو کەم عەقڵە یاخود سەرپەرشتیاری لاوازەکە، کەوایە ئەو ئەم قسانە دەڵێتەوە و نووسەریش دەینوسێتەوە جا الله عز وجل چی فەرموو دەربارەی ئەم کارە؟ فەرمووی (فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُۥ بِٱلْعَدْلِ) واتە سەرپەرشتیارەکەی وشەکان دەرببڕێت و نووسەرەکەش ئەوە بنوسێتەوە کە سەرپەرشتیار دەیڵێتەوە، کەوایە ئەم مانایە بوونی هەیە لە پەڕتوکی الله عز وجل، هەروەها لە سورەتی (الفرقان) الله تعالى دەفەرموێت﴿وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا فَهِىَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ۝﴾[1] ، واتە؛ قسەیەکی پێدەڵێن و ئەویش ئەو قسەیەی پێی دەوترێت دەگوازێتەوە، وە زانایانی فەرمووده -هەروەك دەزانیت- کاتێك لە سەنەدەکە دەگوازنەوە دەڵێت: فڵان بۆی گێڕاینەوە یاخود لە فڵان بە (إملاء)، گوێم لە فڵان بوو بە (إملاء) واتە ئەو دەیوت ئێمەش دەماننوسیەوە، کەوابوو لە واتاکانی (إملاء) دەربڕینی قسەیە بۆ کەسانی تر، جا ئەگەر بەم واتایەمان وەرگرت لە واتاکانی وشەکە لە زمانی عەرەبیدا ئەوا مانای ئایەتەکە بەم شێوەیە دەبێت

---

(١) الفرقان: ٥ .

(ٱلشَّيۡطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمۡ) بە واتای (زيّن لهم)، وە قسەیەکی خستە نێو عەقڵیان و دڵیان ئەوانیش دەستیان کرد بە کارکردن بەو قسەیەی شەیتان پێی وتبوون لە نهێنیدا، وە ئەمە بە هەمان شێوە دەچێتە نێو بابەتی وەحی چونکە ئەو قسە شاراوەیەی دەخرێتە ناو دەروون پێی دەوترێت وەحی، وە بەڵگەیەك هەیە دەیسەلمێنێت کە شەیتان قسەیەکی شاراوە دەخوێنێتەوە بەسەر دەروون و پێی دەوترێت وەحی، بەڵگەی ئەمەش فەرموودەی الله تعالى ﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ ١٢١﴾[1] ، هەروەها فەرموودەی الله تعالى ﴿شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗاۚ﴾[2] ، شەیتان کاتێك قسەیەك دەڵێت و دەیخاتە نێو دەروونەکان جا ئەو دەروونانەی وەڵامی شەیتان دەدەنەوە ئیتر دەست دەکەن بە کارکردن بەم قسانەی پێیان دەگات لە شەیتانەوە، ئینجا ئەگەر وتمان (أملى لهم) واتە (الشيطان أملى لهم) لێرەدا پێویستە بوەستیت و بڵێیت بۆچی الله عز وجل فەرمووی (أملى لهم) نەیفەرموو (أملى عليهم) ؟ لەبەرئەوەی خۆی (إملاء عليهم)ـە ئەی بۆچی فەرمووی (لهم) ؟ یەکەم؛ پیتی لام لێرەدا بۆ (تمليك)ـە؛ وەك ئەوەی شەیتان ئەم قسەیە و ئەم پۆزشانە و ئەم ڕازاندنەوەیەی پێیان بەخشی بێت کەچی ئەوان خۆیان وا دەبینی خاوەنانی ئەوەن کە تیایدان، دان نانێت بەوەی شەیتان وەحی بۆی کردووە بەم قسەیە یاخود ئەم قسەیەی بۆ وتوە، بەڵکو وای دادەنێت کە ئەمە لە بەروبوومەکانی عەقڵی خۆیەتی و لە بەرهەمەکانی بیرکردنەوەی خۆیەتی و ئەمەیە کە پێی گەیشتووە، کەوایە وەك ئەوەیە ئەو قسە شاراوەیەی پێیان بەخشی بێت ئینجا ئەوانیش بوون بە خاوەنی، (أملى لهم) واتە ئەوانی کرد بە خاوەنی ئەوەی پێی وتن، ئەمە هۆکاری یەکەم، هۆکاری دووەم: بۆچی الله عز وجل نەیفەرموو (وأملى عليهم) و بۆچی فەرمووی (وأملى لهم) ؟ چونکە -پاکی و بێگەردی بۆ الله تعالى- ئەگەر فەرمووبای (أملى عليهم) ئەوا ئایەتێکی تر دەبووە دژی ئەمە لە پەڕتوکی الله عز وجل، ئەویش ئەوەیە شەیتان دەسەڵاتی نیە بەسەر هیچ کەسێك ﴿وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُمۖ﴾[3] ، جا ئەگەر بیوتایە (أملى عليهم) بە واتای ئەوە دێت کە چەسپاندی شەیتان دەسەڵات و توانایەکی لەسەریان هەیە لە کاتێکدا شەیتان هیچ دەسەڵاتێکی لەسەر هیچ کەسێك نیە هەروەك الله تعالى لەسەر زمانی ئەو دەفەرموێت (وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ) واتە من هیچ هێز و دەسەڵاتێکم نیە کاتێك بانگت دەکەم بۆ سەرپێچکردنی فەرمانی الله یان بۆ

(١) الأنعام: ١٢١.
(٢) الأنعام: ١١٢ .
(٣) إبراهيم: ٢٢ .

شیرك یان بۆ هەڵگەڕانەوە تەنها بانگت دەکەم و تۆش وەڵامم دەدەیتەوە، بۆیە نەوتنی (علیهم) لێرەدا بۆ ڕەتکردنەوەی هەر دەسەڵاتێکە لە شەیتانەوە لەسەریان هەر بۆیەش کارەکە چڕ بووەوە لە لایەنی جوانکردن (تزیین) و لە لایەنی قسە وتن بۆیان (الإملاء)، ئەگەر بیتوانیبایە ناچاریان بکات لەسەر کارەکە ئەوا بۆی جوان نەدەکردن و ڕاستەوخۆ فەرمانی پێدەکردن و ئەوانیش وەڵامیان دەدایەوە بەڵام هیچ دەسەڵاتێکی نیە لەسەریان هەر بۆیە بۆی جوانکردن و قسەی وتەوە بۆیان، داواکارین لە الله تعالی پێکابێتمان لەوەی بۆی چووینە، کەوابوو (ٱلشَّيۡطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمۡ وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ )

ئێستاش دێمە سەر ئەوەی هەندێك لەوەت بۆ بخوێنمەوە کە ڕوون بووەتەوە بۆ ئەوانە و چۆن شەیتان بۆی جوان کردن و ڕازاندیەوە؟ -سەرنج بدە- وە هەمیشە.. عەرەب دەڵێت: لێدان لە سەر بە ئازار و کاریگەرە، حەسەن بەننا، سەبارەت بە موڕجیئە ئا ئەوانە گەمژەن چونکە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ پەڕتوکەکانی ئەهلی سوننە و جەماعە، وە بخوێننەوە لەبارەی پەیوەندی کردەوە بە ئیمان چییە ئەوا دەیانزانی ئەوان موڕجیئەن و ئەم ناوە بەسەریاندا دادەبەزێنرێت بەڵکو ئەوان کەڕامیەن -پەنا بە الله لێیان- بۆیە ئەوانە لە گەمژە و نەفامترین دروستکراوانی الله ــن -عز وجل- کاتێك دێتە لای ڕافیضیێکی پیس دەڵێت ئەمە وەلی ئەمرە و گوێڕایەڵیکردنی واجبە، لەوانە گەمژەتر نیە لەسەر ڕووی زەوی هەر بۆیە زۆر باسیان ناکەین چونکە شایستەی ئەوە نین هەر باسیش بکرێن، سەیر بکە ئەم حەسەن بەننایە چی دەڵێت تاوەکو بزانیت ئایا ئەو حەقی بۆ ڕوون بۆتەوە، دوای ئەوەی حەقی بۆ ڕوون بۆتەوە ئایا شەیتان بۆی جوان کردووە و قسەی بۆ کردووە یان نا؟ وە شوێنکەوتووەکانی لەسەر بۆچوونی ئەون، سەرنج بدە وتەی یەکەمی ئەم کابرایە لە پەیامەکانی، دەڵێت: "جا هەڵوێستی مسوڵمان چۆن دەبێت کە باوەڕی بە الله و قسە و وشەکانی ئەو هەیە ئەگەر گوێبیستی ئەم ئایەتە ڕوون و ئاشکرایانە و جگە لەمانەش بوو لە فەرموودەکان و حوکمەکان پاشانیش خۆی ببینێتەوە کە حوکمی بەسەردراوە بە قانونێك کە بەریەکدەکەوێت لەگەڵیان"، بۆی ڕوون بۆتەوە یان نا؟ بۆی ڕوون بۆتەوە، پاشان دەڵێت: "جا ئەگەر داوای دەستکاریکردن بکات پێی دەوترێت بیانییەکان بەمە ڕازی نابن و پەسەندی ناکەن پاشان دەوترێت دوای ئەو تەسك و تەنگکردنەوەیە میسرییەکان سەربەخۆن و لە کاتێکدا تا ئێستا نەبوونەتە خاوەنی ئەوەی خۆشگوزەران بین بە ئازادی دین" واتە قوبتی بژیێت بە ئاسوودەیی و ئێزیدی بژیێت بە ئاسوودەیی، نەگەیشتوونە بەم ئاستە بۆیە شەریعەتی ئیسلامی جێبەجێ ناکەن! ، پاشان دەڵێت: "بەهۆی ئەوەی ئەم قانونە دەستکردانە هەروەك بەریکدەکەوێت لەگەڵ دین و دەقەکانی بە هەمان شێوە بەریەکدەکەوێت لەگەڵ هەمان دەستوری دەستکرد کە بڕیاری داوە دینی دەوڵەت ئیسلام بێت جا چۆن ئەم دووانە لەگەڵ یەکتر بگونجێنین ئەی خاوەن ژیرییەکان؟ " ئەمە پرسیارێکە لەویەوە منیش بە هەمان

شێوە دەپرسم: ئەی خاوەن عەقڵ چۆن شەرعی الله عز وجل لەگەڵ ئەم قانون و دەستورانە دەگونجێنی؟ هەر کەسێك خاوەنی کەمێك عەقڵ بێت دەبێت وەڵام بداتەوە بەوەی ناکرێت ئەم دوو دینە لەگەڵ یەکتر بگونجێنرێن و هەروەها لە نێوان ئەم دوو شەریعەتە، شەریعەتی الله عز وجل شتێکە و شەریعەتی ئەوانەش شتێکی ترە و ناکرێت هاوڕێك بکرێن، ئەگەر ئەمەت زانی لەم پیاوەوە، ئەمەش زیاتر لە زانست و زانیارییەکەی -سەرنج بدە- ئەمەش بە هەمان شێوە لە پەیامەکانی دەڵێت: "سەبارەت بە ئیخوان موسلیمون ئەوان هەرگیز پەسەندی ئەم قانونە ناکەن و پێی ڕازی نابن لە هیچ بارێکدا، وە کاریش دەکەن بە هەموو ڕێگەیەك بۆ ئەوەی شەریعەتی ئیسلامی دادپەروەر و پایەبەرز شوێنی بگرێتەوە لە لایەنەکانی قانون" بۆی ڕوون بۆتەوە یان نا؟ بەدڵنیاییەوە بۆی ڕوون بۆتەوە، واتە دەستورێك هەیە حوکمی پێدەکرێت جا ئەوانیش ڕازی نین بەم دەستورە و دەیانەوێت کار بکەن لەسەر ئەوەی حوکم بکرێت بە شەرعی الله عز وجل چونکە ناکرێت گونجاندن بکرێت لە نێوان شەریعەتی الله عز وجل و ئەم قانونانە، ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا﴾ ، "السارق والسارقة فاسجنوهما" چۆن دەتوانی ئەم دوو دەقە بگونجێنی؟ دەقێکی خوایی و دەقێکی شەیتانی، ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٍ﴾ ئەمە چۆن دەگونجێنی لەگەڵ ئەو مەرجانەی دانراون بۆ ئەنجامدانی زینا و هەروەها بەوەی لە بابەتە کەسییەتییەکانە؟ ئارەق؛ (فاجتنبوه) چۆن دەیگونجێنی لەگەڵ "دروستی بکەن و بیخۆنەوە و بیفرۆشن" ؟ کەوایە ئەم کابرایە دان دەنێت بەوەی ئەم قانونانە بەریەکدەکەوێت لەگەڵ شەریعەتی الله عز وجل پاشانیش دەڵێت ئێمە کار دەکەین لەسەر ئەوەی شەرعی الله عز وجل حوکم پێبکەین جا ئەمە وتەی ئەوە، بۆچوونی ئەو دەربارەی دەستوری میسڕی دوای ئەوەی زانی کە ئەم دەستورانە ناکرێت بگونجێنرێت لەگەڵ یەکتر، وە ئەوان دەیانەوێت حوکم بکەن بە شەرعی الله عز وجل، سەرنج بدە شەیتان چۆن بۆی جوان کردووە و قسەی بۆ کردووە، دەڵێت: "وە بەم پێیە بە هەمان شێوە دەکرێت بڵێین لە دڵنیاکردن و ئاسوودەبوونەوە کە ڕێسایە سەرەکییەکانی دەستوری میسڕی لەسەر دامەزراوە دژیەك نیە لەگەڵ ڕێساکانی ئیسلام، وە دوور نیە لە سیستەمی ئیسلامی و نامۆ نیە بەو" (سول له الشيطان وأملى له)، شتێکی تر؛ سەرنج بدە وتەیەکی تری دەڵێت: "ئێمە بە بنەما سەرەکییەکان تەسلیمی حوکمی دەستوری دەبین بەو پێیەی هاوڕێکە بەڵکو وەرگیراوە لە سیستەمی ئیسلامی" ئەمە وتەی دووەمی بوو، وتەی سێیەمی؛ دەڵێت: "ئیخوان موسلیمون باوەڕی وایە کە سیستەمی حوکمی دەستوری نزیکترین سیستەمی حوکمە لە ئیسلام کە لە هەموو جیهاندا هەیە" واتە ئیسلام نیە بەڵکو سیستەمێکی نزیکە لە ئیسلام پاشان سەرنج بدە چی دەڵێت: "وە ئەوان یەکسانی ناکەن لەگەڵ هیچ سیستەمێکی تر" دەستەواژەکە بە تەواوی دەخوێنمەوە "ئیخوان موسلیمون باوەڕی وایە کە سیستەمی حوکمی دەستوری

نزیکترین سیستەمی حوکمە لە ئیسلام کە لە هەموو جیهاندا هەیە، وە ئەوان یەکسانی ناکەن لەگەڵ هیچ سیستەمێکی تر"، سەرنج بدە ئەمەیان؛ دەقی چوارەمی کە بە هەمان شێوە لە "الرسائل" هەیە، دەڵێت: "لە دەقەکانی دەستوری میسرِی ئەوەی کە ئیخوان موسلیمون وای دەبینێت ناڕوون و ئاڵۆزە، کە بوارێکی فراوان جێدێڵێت بۆ ئەو لێکدانەوە و تەفسیرانەی مەبەست و ئارەزووەکان بۆی دەچن، بۆیە پێویستی بە ڕوونکردنەوە و دیاریکردنە ئەمە یەکەمیان، دووەمیان؛ ئەوەیە کە ئەو ڕێگایەی جێبەجێکردنەی بەهۆیەوە دەستور دەچەسپێنرێت و هەروەها بەهۆیەوە دەگەنە دروێنەکردنی بەروبوومی حوکمی دەستور لە میسرِ، ئەوا ڕێگایەکە ئەزموونەکان سەلماندویانە کە شکستخواردووە" یانی حوکمی دەستور هەندێك بەروبوومی هەیە و ئەم بەروبوومانە دروێنە دەکرێن بەڵام بەهۆی شکستهێنان لە جێبەجێکردندا ئەوا ئەم بەروبوومانە دروێنە نەکران، جا حەسەن بەننا ئاماژە بۆ ئەوانە دەکات کە چاوبخشێننەوە لە شێوازی جێبەجێکردنی دەستور و هەروەها چاوبخشێننەوە بە هەندێك ماددەی دەستور کە چەند ڕوویێك هەڵدەگرن بەوەی ڕوونی بکەنەوە مەبەستیان چییە لەم سیستەمە و مەبەستیان چییە لەم ماددانە، ئەمە قسەی ئەو بوو، دوای ئەمە چی دەڵێت؟ "هەر بۆیە ئیخوان موسلیمون هەوڵ و کۆشش دەکەن بۆ ئەوەی دەقە نادیار و ناڕوونەکان دیاری بکرێن لە دەستوری میسرِی، وە ئەو ڕێگایەی بەهۆیەوە دەستوری پێجێبەجێ دەکرێت دەستکاری بکرێت، وە گومانم وایە هەڵوێستی ئیخوان ڕوون بووەوە بەهۆی ئەم بەیاننامەیە و کاروبارەکانیش گەڕاونەتەوە بۆ سەرچاوە دروستەکەی" وتەکەی کۆتایی هات، ئەمە وتەی ئەو بوو لەبارەی دەستور و لەبارەی بەریەککەوتنی دەستور لەگەڵ شەریعەت، باشە، ئەی قسەی چییە لەبارەی سیستەمی پەرلەمان -نوێنەران- ئایا حەقی بۆ ڕوون بۆتەوە پاشان شەیتان بۆی جوان کردووە و ڕازاندووەتەوە یان نا؟ -سەرنج بدە- هاوکات کاتێك باسی ئەم ناوە دەکەین مانای ئەوەیە قسەکەی جێبەجێ دەبێت لەسەر هەر کەسێك کە لەم حیزبەدا بێت و لە هەر وڵاتێك لە وڵاتانی جیهان بێت، لەبەرئەوەی ئەمە ئەو سەرەیانە کە لێی وەردەگرن ئەم پیسە -پەنا بە اللە-، سەرنج بدە چی دەڵێت لەبارەی ئەنجومەنەکانی نوێنەران، کاریان چییە؟ -ئەمە دانپێدانانی ئەوە- دەڵێت: "نوێنەران؛ ئەوانەی نوێنەرایەتی گەل دەکەن، وە هەڵدەستن بە جێبەجێکردنی دەستورەکەی و پاراستنیشی (ئەمە لە کاری نوێنەرانە هەروەکو هاتووە لە قانون و دەستورەکان، بەڵام وردەکاری ژیانی نوێنەرایەتی سەرنج بدە چی دەڵێت، بە هەمان شێوە لە -الرسائل-) وە ئێمە لە ژیانی هاوچەرخمان لە ئەوروپاوە ئەم سیستەمەی نوێنەرایەتیمان گواستەوە کە ئێستا حکومەتەکانمان لەژێر سایەیدا دەژین، وە دەستورەکەمان لەسەر ئەم بناغەیە داناوە" کەوایە بابەتەکە دەداتە پاڵ خۆی هەرچەندە ئەم سیستەمەی نوێنەرایەتی لە کوێ هێنا؟ وتی لە ئەوروپا، پاشان پرسیارێك دێتە پێش؛ "جا ئایا تا چ ڕادەیەك ئەم

سیستەمە جێبەجێ دەبێت لەسەر ئیسلام (واتە سیستەمی نوێنەرایەتی کە هێناویانە لە ئەوڕوپا، تا چ ڕادەیەك ئەم سیستەمە جێبەجێ دەبێت لەسەر ئیسلام) جا ئایا تا چ ڕادەیەك ئەم سیستەمە جێبەجێ دەبێت لەسەر ئیسلام، وە تا چ ڕادەیەك سودمان لێی بینیوە (دەیداتە پاڵ خۆی) بەدرێژایی ئەم ماوەیە؟" وەڵام دەداتەوە: "زانایانی فیقهی دەستوری دەڵێن (کێن ئەوانە؛ ئەبو حەنیفە؟! حاشا لەو)، زانایانی فیقهی دەستوری دەڵێن: سیستەمی نوێنەرایەتی دادەمەزرێت لەسەر لێپرسراویەتی دەسەڵاتدار، وە دەسەڵاتی گەل و ڕێزگرتن لە ویستەکەی"، دەسەڵات بۆ گەل، وە ڕێزگرتنی ویستەکەی؛ کەسانێك شیوعییەکانیان هەڵبژارد، ئەو کاتە چی دەڵێیت؟ دەڵێت: "ڕێز دەگرم لە ویستی گەلی فەڵەستینی و بە پیرۆزی دادەنێم" ئەم قسەیە لێرەوە وەرگیراوە، لە شێخەکەی و لە گەورەکەی -سەرنج بدە- "وە دەسەڵاتی گەل و ڕێزگرتن لە ویستەکەی، وە هەروەها هیچ بەربەستێکی تێدا نیە کە ڕێگر بێت لە یەکڕیزی گەل و کۆبوونەوەی وتەکانی"، ئەم بابەتانەی نوێنەرایەتی و پێکهێنانی حیزبەکان ڕێگر نیە لە کۆبوونەوەی گەل و یەکگرتوویی وتەکانی، "وە هەروەها هیچ بەربەستێکی تێدا نیە کە ڕێگر بێت لە یەکگرتنی گەل و کۆبوونەوەی وتەکانی، وە پەرتەوازەیی و ناکۆکی مەرج نین تیایدا (واتە لە ژیانی نوێنەرایەتی) هەرچەندە هەندێکیان دەڵێن: لە لێکەوتەکانی سیستەمی نوێنەرایەتی پەرلەمانی؛ حیزبایەتییە بەڵام ئەگەر ئەمە نەریت بێت ئەوا بنچینە نیە لە بەهاکانی ئەم سیستەمە" واتە لە بنچینەکانی ژیانی نوێنەرایەتی نیە کە حیزبانێك هەبن و پەرتەوازەیی و لێکترازان هەبێت و یەکڕیز نەبن، نەخێر ئەمە بنچینەکە نیە بەڵام ئەمەیە کە لەسەری ڕۆیشتوون، "بەڵام ئەمە ئەگەر نەریتێك بێت ئەوا بنچینە نیە لە بەهاکانی ئەم سیستەمە چونکە دەکرێت جێبەجێ بکرێت بەبێ ئەم حیزبایەتییە و بەبێ زیان گەیاندن بە ڕێسایە بنچینەییەکانی، وە بەگوێرەی ئەمەش ئەوا لە ڕێساکانی ئەم سیستەمە نیە (مەبەستی نوێنەرایەتییە) ئەوەی کە دژ بێت لەگەڵ ئەو ڕێسایانەی ئیسلام دایناون بۆ سیستەمی حوکمڕانی، هەر بەم پێیەش لە سیستەمی ئیسلامی دوور نیە و نامۆ نیە بەو" ئەمە هەمووی لە (الرسائل)، ئەوەی کە پێی دەردەچیت ئەوەیە کە ئەم کابرایە دان دەنێت بەوەی؛ ئەوەی کە کارمان پێکردووە و کاری پێدەکەین ئیسلام نیە بەڵکو شتێکی نزیکە لە ئیسلام، ئەمە پوختەی قسەکانیەتی، کەوایە هیدایەتی لە ئیسلام بۆ ڕوون بووەوە پاشانیش بۆی ڕوون بووەوە کە ئەمەی تر لە ئیسلامدا نیە بەڵکو نزیکە لە ئیسلام، باشە، نموونەی ئەوانە مەگەر ئەم فەرموودەیەی الله ـیان -عز وجل- بەسەردا جێبەجێ نابێت (إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَى) زانی هیدایەت لە کوێیە و زانی گومڕاییش لە کوێیە بەڵام ویستی خۆی بخاتە پاڵ ئەوانە جا چووە نێو ژیانی نوێنەرایەتی و چووە نێو ژیانی دەستوری، وە ....................... بەوەی کە ئەو لە پێناو نوێنەرایەتی مرد لە میسڕ، ئەو خۆی پاڵاوت و ئینگلیز

هەرەشەیان لێکرد بۆ ئەوەی بکشێتەوە بەڵام قبوڵی نەکرد بۆیە کوشتیان لە شەقام، وە تا ئێستاش کلکەکانی لەسەر ئەم شێوازە و لەسەر ئەم پەیامانەن -الرسائل- لە هەر شوێنێك بن لەسەر زەوی، ئوممەت تووشی هیچ خراپەیەك نەبووە وەك ئەوەی تووشی ئەمانە هاتووە، (ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ ۖ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ) ئەم نهێنیانەیان - إِسْرَارَهُمْ - چییە؟ واتە شتێك هەیە وتویانە و شتێکیش هەیە شاردویانەتەوە، ئەو شتەی شاردویانەتەوە ئێستا ئاشکرایە لەبەرچاوان هەرچەندە ئەگەر بە زمانیشی بڵێت: ئێمە دەچینە ناویەوە بۆ ئەوەی کار بکەین بەوەی هاوڕێکە لەگەڵ شەرع، وە دژی ئەوە بوەستینەوە کە هاوڕێك نیە لەگەڵ شەرع، ئەمە ڕواڵەتەکەیەتی، باشە، ئەی ناوەوەی؛ کار دەکات بە هەموو قانونەکان یان نا؟ کەوایە (وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ) کاتێك دەچێتە ئەوێ ئەو بڕیاری داوە کە کار دەکات بە هەموو ئەو شتانەی فەرمانی پێدەکرێت نەك هەندێك لەوەی فەرمانی پێدەکرێت (سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ ۖ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ) لەبەرئەوەی تەنها بە چوونە ناوەوەی لەگەڵ ئەوانە ناکرێت لە چوارچێوەی پێکهاتەیەك بێت پاشان گوێڕایەڵیان بکات لە هەندێك کار وفەرماندا و سەرپێچی بکات لە هەندێك کار وفەرماندا، ئەوەی سەرپێچی بکات ئەوا سزای دەدەن بەپێی قانون چونکە گوێڕایەڵی نەکردنی قانون سەرپێچی و یاخیبوونە، وە ئەوانە کاتێك وتیان: گوێڕایەڵیتان دەکەین لە هەندێکدا، ئەوا لە ناوەوەیان ئەمە هەیە کە ئێمە تەسلیمتان دەبین بەتەواوی، وە هەر ئەمەیە ئێستا ڕوویداوە، چون یەکە هاوڕێك بێت لەگەڵ شەرع یان هاوڕێك نەبێت ئەوا ئەو لەگەڵ دەستورە و لەگەڵ قانونە تەنانەت ئەگەر ببێتە هۆی دژایەتیکردنی الله عز وجل و ببێتە هۆی دژایەتیکردنی پێغەمبەر ﷺ و ببێتە هۆی دژایەتیکردنی مسوڵمانان، ئەوا هەر ملکەچ دەبێت بۆ فەرمانەکان بەتەواوی، کەوایە ئەم قسەیەیان "نطيعكم في بعض الأمر" (وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ) واتە ئەوان گوێڕایەڵیان دەکەن لە هەموو فەرمانەکاندا نەك لە هەندێك کار وفەرماندا، لەوانەیە لە سەرەتای چوونە ناوەوەکە دەڵێت: گوێڕایەڵیان دەکەین لە هەندێك فەرماندا، بەڵام دەزانێت ئەگەر چووە ناویەوە ئەوا گوێڕایەڵیان دەکات لە هەموو فەرمانێکدا بۆیە لێرەوە الله تعالى فەرمووی (وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ )، سەرنجی کۆتایی ئەوانە بدە (فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ ) هەر کەسێك بمرێت لەوان لەسەر ئەم بارودۆخە کە لەگەڵ ئەوانە دایە ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله دایبەزاندووە، کاتێك دەمرێت لە کاتی گیانکێشاندا فریشتەکان لە ڕووخسار و پشتیان دەدەن، ئێمە هەست بەمە ناکەین بەڵام زانا و بەئاگا کە هیچ شتێکی لێ شاراوە نابێت هەواڵی پێداوین کە هەر کەسێك واز لە هیدایەت بێنێت و بچێتە پاڵ کەسانێك کە ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە پاشانیش بمرێت لەم جێگە و

بارەدا ئەوا لە کاتی مردنەکەیدا فریشتەکان لە ڕووخساریان و پشتیان دەدەن، وە تۆ دەزانیت کە ئەم جۆرە مردنە تەنها بۆ کافران پێش دێت ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ﴾[1] ، کەوایە ئەم شێوازە لە مردندا تەنها بۆ کافرانە (وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ)، ئەی لێرەدا چی دەفەرموێت (فَكَيۡفَ إِذَا تَوَفَّتۡهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ ) هەمان ئایەتە بەڵام لێرەدا تەنها وشەی کافران لابراوە لەسەر ئەوەی کە ئەم شێوازە لە مردن تەنها بۆ کافرانە، کەوابوو ئەوانە الله تعالی تەکفیری کردوون ئەگەر مردن لەسەر ئەم بارە، لە ژیانیدا موڕتەدە و ئەمەش حاڵیەتی لە کاتی مردن، هۆکاری کوفری ئەوانە ئەم وتەیەیان بوو بۆ ئەوانەی ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله دایبەزاندووە " سَنُطِيعُكُمۡ فِي بَعۡضِ ٱلۡأَمۡرِۖ" بەهۆی ئەم قسەیەوە الله عز وجل تەکفیری کردن، زانایان چی دەڵێن دەربارەی ئەم وتەیەیان؟ -سەرنج بدە- ئیمامی تەبەڕی -رحمه الله- دەڵێت: "( إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَى ) -پاشان تەفسیری دەکات- الله تعالی دەفەرموێت: بەڕاستی ئەوانەی پاشەوپاش گەڕانەوە دواوە و کافر بوون بە الله دوای ئەوەی حەقیان بۆ ڕوونبووەوە و هەروەها مەبەستی ڕێگاکەشیان بۆ ڕوونبووەوە، جا ڕوونی و ڕەوانی بەڵگەیان ناسی پاشانیش گومڕاییان هەڵبژارد بەسەر هیدایەت وەك عینادیێك بۆ فەرمانی الله تعالی هەروەك باسی کردووە دوای زانست و زانیاری"، کەوایە ئیمامی تەبەڕی وای دەبینێت کە ئەوانە؛ ئەوانەی دەڵێن بەوانەی ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله عز وجل دایبەزاندووە: گوێڕایەڵیتان دەکەین لە هەندێك کار وفەرماندا، جا دەڵێت ئەمە کوفرە، وە ابن کثیر -رحمه الله- لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: "واتە جیا بوونەوە لە ئیمان و گەڕانەوە بۆ کوفر"، ئیبن حەزم -رحمه الله- دەڵێت: "بۆیە الله تعالی بە موڕتەد و کافر هەژماری کردن دوای ئەوەی حەقیان دەزانی و دوای ئەوەی هیدایەتیان بۆ ڕوون بووەوە تەنها بەهۆی وتەکەیان کە وتیان بۆ کافران"، چیان وت بە کافران؟ (سَنُطِيعُكُمۡ فِي بَعۡضِ ٱلۡأَمۡرِۖ)، وە ئیمامی الشنقيطي -رحمه الله- دەڵێت: "ڕواڵەتەکەی (إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَى) کەسانێکن کافربوونە دوای ئیمان هێنانیان"، وە کۆکەرەوەی ئەوەی زانایان وتیان ئەم فەرمودەیەی الله تعالی ـیە (وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ) لەبەرئەوەی تەنانەت ئەگەر هاوڕێك بێت لەگەڵ شەرع و گوێڕایەڵی بکەیت ئەوا هەڵدەگەڕێیتەوە لە دینی الله عز وجل، ئەوانەی ڕقیان دەبێتەوە لەوەی الله دایبەزاندووە ئەگەر شتێکیان هەبێت هاوڕێك بێت لەگەڵ شەرعی الله، وە ئەم جۆرە کەسانەش گوێڕایەڵیان بکەن لەوەی هاوڕێکە لەگەڵ شەرعی الله ئەوا هەڵدەگەڕێنەوە لە دینی الله عز وجل، چونکە

(١) الأنفال: ٥٠.

ئەوەی کە هەڵیانبژاردووە بەهۆی ئارەزووەکانیان بووە نەك وەك خۆشەویستنێك لە پێناو الله عز وجل، وەریانگرتووە لە جوولەکە و وەریانگرتووە لە نەسارا و وەریانگرتووە لە ئێزیدی و وەریانگرتووە لە عەلمانیەت و وەریانگرتووە لە سابیئە، وە هەندێك شتیان وەرگرتووە لە دین (ئیسلام) بۆیە وەریان نەگرتووە لە پێناو الله عز وجل و وەك گوێڕایەڵیکردنێك بۆ ئەو، بەڵکو باشتریان نەدۆزیوەتەوە لەوەی هەیە لە لای الله عز وجل هەر بۆیە زیادیان کردووە بۆ قانونەکانیان، بەڵام ئەگەر شتێکیان دۆزیەوە لە دینی ئێمە کە یەکنەگرێتەوە لەگەڵ هەوەس و ئارەزووەکانیان ئەو کاتە ناکرێت بیخەنە نێو دینەکەیان و دەستورەکەیان، ئەگینا الله تعالی حەڵاڵ و حەڕامی داناوە ئیتر چۆن حەڵاڵ و حەڕام دادەنێن؟!
(فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ )
ئەوەی کە لەلای ئەوان هەیە الله عز وجل توڕە دەکات، وە ئەوانەشی هیدایەتیان بۆ ڕوون بووەوە پاشانیش چوونە پاڵ ئەوانە؛ شوێنی ئەوە کەوتن کە الله عز وجل توڕە دەکات ئینجا کردەوەکانیان پووچ و بەتاڵ بووەوە، هیچ شتێکی نەما تەنانەت یەك چاکەش، بەڵام سەبارەت بە ڕۆژووەکانی و نوێژەکانی و زەکاتی و هاوشێوەی ئەمانە؛ فەرموودەیەکی رسول الله (ﷺ)هەیە کە دەفەرموێت هەر کەسێك کردەوەیەك بکات بۆ الله تعالی ئەوا الله بۆی قەرەبوو دەکاتەوە لە دونیا، وە فەرموودەکەم بە ماناکەی باس کرد کە لە لای ئیمامی موسلیم -رحمه الله- هاتووە، أقول قولي هذا واستغفر الله لي ولكم وجزاكم الله خير الجزاء وبارك فيكم.

**وەرگێڕان و ئامادەکردنی**
**پێگەی ڕاستەڕێ**

